# بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله رب العالمين ، والصلاة والسلام على سيدنا محمد سيد المرسلين ، وعلى آله وصحبه الغر الميامين ، وبعد ؛
شاکەلی مزۆڤێکی گەورەو ناسراو بۆلە ناوچەی گەرمیان . لە پاش وەرگرتنی تەریقەوە تەسەوف ، وازی لە ئوموراتی دنیایی هێنا وە زۆر بەی کاتی لە ڕێی خوا ناسی وە ئوموراتی دینی دا بردوە تەسەر . عرفان و تەسەوف وە هەروەها عەشقی بە سولوك و سوفیایەتی پلەیکی گرنگی ریگەی عشقی ئیلاهیە کە شاعر بە سەری بردووە وە بە بۆنەی ئەم عشقەوە بوتە شاعرێکی ناسك خەیاڵ بە بەرزی عرفان . خوالێ خۆشبوو « شێخ ئەحمەد » گەیشتە پلەیکی بەرزی عرفان و تەسەوفی وە مەحبوبی حضرتی باوکم شێخ علاء الدين وزور خوشەویسی منیش بو . تارادەیەك پلەکانی گرنگی تەسەوفی بری بوو کە خۆی مردنی خۆی پێش بینی کرد بو . چەند جارێك زور بە عشق و موحەبەتەوە داوای لێ کردم کە برۆم بۆ دیدەنیان ، کاتێ کە توانیم برۆم بۆ شاکەل زۆر خوشم ویستم شێخ ئەحمەد ، هات بەپیری مەوە ، دەستم گرت و پێکەوە چوونیە ماڵەوە ، لەئاشکرایی دا رەنگو ڕووی باش بوو ، کە دانیشتین ڕووی تێ کردم ووتی قوربان غەزەلێکم ووتوە وبەدەنگی خۆم تۆمارم کردوە وە دامناوە بو رۆژێکی وەها اجازە هەیە گوێ بۆ ڕاگرین . غەزەلەکەم شعرە دەست پێ ئەکات :

گوڵاڵەی ڕێنی من ئازیز بەبێ تۆ تازە ناپێتو ئەگەرچی ڕۆژی نەورۆزە گوڵی گوڵشەن ئەپشکێتو

وەلە شعرێکی کەی ئەم غەزەلەدا ئەڵێت :

وەکو تۆ مورشیدی ئەعزەم تەریقەی وەعیشرعی نی لەکاتی مردن وحەشرا موریدی خوی ئەدۆزێتو

کە گوێمان لەم شعرانە ڕاگرتبوو سەرنجم دا شێخ ئەحمەد ڕەنگی تێك چوو لە وکاتەوا سفرەی نانیان ڕاخستبوو کە شێخ ئەحمەد ویستی پارویێك بە با بۆرەی دیم چاوی پڕ بوو لە فرمێسك لە ئازاردا ڤی گرانم هەربەو ئازارەوە فەوتی کرد . خوم لەمراسمی بەخاك سپاردنیا لەوێ بوم . کاتێ ئەسپەردە کردنی سەرنجی روخسارییم دا هەروەك گوڵاڵە سورەیك لە قەبرەکادا سوورهەڵگەرابو وە بەم جورە ئەوشتانە کە خوێ بەئاواتەوە بوو لەسەرەمەرگیا بە تەواوی رووی دا .
یارەبی بەرەحمەت بێ وە روحی بە جەنەت شاد بێ انشاء الله .

شێخ عوسمان شێخ علاء الدين
نەقشبەندی

# بە ناوی خوای گەورە و میهرەبان

شاعیری بەناوبانگی دەشتی گەرمیان شێخ ئەحمەدی شاکەلی لەنێوان شاعیرە کلاسیکیەکانی کوردا شوێنێکی بەرز و گرنگی هەیە. هۆنراوە نیشتمانیەکانی ئەم شاعیرە جێی شانازین شاکەلی لەخزمەت جەنابی باوکم دا شێخ عوسمانی نەقشبەندی تەمەسوکی بە تەریقەی نەقشبەندی کردووە وە بەتەواوی شانی بۆ ئەرکی گرانی تەسەوف شل کرد بوو. خۆشەویستی بێ ئەندازەی جەنابی باوکم لە دڵی دا بوو بە هۆی سەرچاوەی ئیلهامی شیعرەکانی، کە هەر وەک ئەبینین زۆر بەی شیعرەکانی بۆ ئەوانە. برای بەڕێز ماموستا جەمال زەحمەتێکی زۆری گرتبووە ئەستۆ بۆ کۆکردنەوەی هۆنراوەکانی بەڵام بە داخەوە دیوانەکەی هەڵەی چاپی زۆر وە کەموکوڕیکی زۆری هەبوو. من کە هاتبوم بۆ خزمەتی جەنابی باوکم لە ئەستەموڵ فەرمانیان دا بۆ ساغ کردنەوەی دیوانەکەی شاکەلی کە برای بەڕێز کاک "خالد رفعت الفقیه" برادەرێکی لبنانیەو موریدی جەنابی باوکە وە هەرچەندە بە زمانی کوردی ئاشنایی نیە، بەخەتە جوانەکەی دیوانەکەی شاکەلی نوسیەوە. منیش هەرچەند خۆم لەو رادەیە دا نازانم بەڵام لەسەر فەرمانەکەی جەنابی باوکم وە هەر بە یارمەتی خوایان ئەرکی ساغ کردنەوەی دیوانەکەم گرتە ئەستۆ. هیوام وایە توانیبێتم خزمەتێکی هەرچەندە بچوکم کردبێ بەئەدەبەکەمانەوە ببێتە هۆی رەزامەندی خوێنەرانی ئازیز.

"ناصح"ی نەقشبەندی

## پێشـەکی

کاتێ نووسـەرێك ئەیەوێ دیوانێك بە چاپکراوی بخاتە پێش
چاوی خوێنەران ئەبێ بە شـێوەیەك بێ کەجێی ڕەزامەندیـان
بێ و دوور لە نامە وزووعی بێ ، جگەلەوەش ئەبێ بە وردی بچێتە
ژنج و بناوانی بەرهەمەکەوەو بارووسرووشتی شاعیرەکـە
فەراموش نەکا بۆ ئەوەی بگاتە سـەرچاوەی ئیلهامی شاعیرەکە.
ئەم دیاردەیە لەناو شـاعیرە کوردەکان دا بە ئاشـکرا دیـــارە ، چ
کلاسیکی یەکان ،چ نوێکان ،لە هەمان کات دا ژیانی سـۆفیگەری
بەگشتی لەکوردستان دا ڕۆڵێکی گەورەی بینیوەلە دروســـت
بوون و پێگەیاندنی شـاعیران و ئەدیبان دا. بە تایبەت ئـەو
شـاعیرانەی کە پەیوەندیان لەگەڵ شـێخەکانی تەریقەتی
نەقشبەندی دا هەبووە ،کە مەڵبەندیان لەکوردستانی عێراق دا
تەوێڵە و بیارە بووە.
ئەوەی تۆزێ شـارەزایی هەبێت لە ئەدەبی کلاسیکی دا شـارە
زایشی لە تەریقەکان دا هەیە. چونکە ئەم دووشـتە زۆرلە یەکترەوە
نزیکن و بەبێ یەکتری نەژیاون، بەکورتی شـێخەکانی تەوێڵەوبیـارە
سـەرچاوەیەکی ڕوونی ئەم تەریقەن کە بەهۆی مەولانا خالیدی

نەقشبەندی یەوە هاتووەتە کوردستانی عێراقەوە لە پاش ئەوەی چووە هیندستان و دوو ساڵ لای شیخ عەبدوڵلای دەهلەوی مایەوەو بەگەڕانەوەی مەولانا بۆعێراق تەریقەتی نەقشبەندی پەرەی سەند. لە دوای مەولانا خالید چەند زاتێکی ناودار بەدوای یەکا ئیرشادیان کردووە لەوانە:

١. شێخ عوسمانی تەوێڵە: ١٧٧٤ـ١٨٦٤ ز.

٢. شێخ بەهادین: ١٧٩١ـ١٨٧٢ ز.

٣. شێخ عومەری بیارە ـضیاء الدین: ١٨٣٩ـ١٩٠٠ ز.ـ نازناوی شیعری فەوزی بووە.

٤. شێخ نەجمەدین: ١٨٦٢ـ١٩١٨ ز.

٥. شێخ عەلادین: ١٨٥٤ـ١٩٥٠ ز.

٦. شێخ عووسمانی دووەم ـکە ئێستا لە ژیان دایە ـودانیشتووی گوندی دووڕووە مەبەستم لەم ناوبردنی ئەم زاتانە ئەوەیە شێخ ئەحمەدی شاکەلی خۆی پەیوەندی بە شێخ عەلادینی بیارەو بووەو سەرەتای شیعروتنی ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی بەهێز بوونی پەیوەندی لەگەڵ نەقشبەندی یەکان دا. هەروەک چۆن مەولەوی ـ شێخ عەبدورڕەحیمی تاوەگۆزی، سەرچاوەی

ئیلهامی شیعری لە شێخ عوسمانی تەوێڵەوە بووە، شێخ محەممەدی مەحوی خەلیفەی شێخ بەهادینی کوڕی شێخ عوسمان بووە، شێخ ئەحمەدی شاکەلیش یەیەکێکە لەو سۆفی یە بەرزانەی سەر بە نەوەکانی ئەم شێخانە یەکە شێخ عوسمانی بیارە یە.

هەروەکو لەم دیوانەدا باسی چۆنیەتی پەیدا بوونی پەیوەندی شێخ ئەحمەدم کردووە لەگەڵ شێخ عوسمان دا ئەوەش لەساڵی ١٩٤٧ زدا بووەلە ناوچەی کفری و شاکەل. ئیتر لەوکاتەوە ئیلهامی شیعری شێخ ئەحمەد ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو. خوێندنەوەی شیعرەکانی ئەم دیوانە هەموو ڕاستی یەك ڕوون ئەکانەوە. هەروەك لەم دوو بەیتەدا ئەوەمان بۆ ڕوون ئەبێتەوە:

ئەتەم[٢] وەك عوسمان چرای دووسەرا — خسووس ساحێبی ضمنیة الکبریٰ[١]

پەروەردەی دەستی شاهی عوسمانم — من یادگاری دەستی ئەوانم

١) ضمنیة الکبریٰ الأتم: پلەو مەقامێکە کە ئەولیاکان ئەیگەنێ.

٢) ئەتەم: الأتم ـ تەواوکراو

## کورتە ژیانی شێخ ئەحمەدی شاکەلی[1]

شێخ ئەحمەد کوڕی شێخ محەمەد کوڕی شێخ سەعیدی شاکەلە، ئەم شێخ سەعیدە کە باپیری شێخ ئەحمەدە هەر لە کۆنەوە لەم ناوچەیەدا پەروەردە بووە، پیاوێکی ناودارو بە دەسەڵاتی دین و دنیا بووە، ئەم کابرایە شاکەلی ی بەسەنەدو بەسەندی تاپۆی ئەوکاتە کەپێ یان وتووە سەنەدی خاقانی سەندووە. لە پاش وەفاتی شێخ سەعێد، شێخ مەحموود لە جێگەی دائەنیشێ، لە گوندی "کەلار" کە ئێستاکە قەزایەکی سەر بە پارێزگای سلێمانی یە، هەر لەو کاتەدا شێخ محەمەدی باوکی شاعیر لە شاکەل ئەبێ، پاش ماوەیەك ئەویش وەفات ئەکات و شێخ ڕەزا ئەچێتە جێگای جا لەوکاتەدا کە "مەلا مستەفا بەگی خولماری" لە شاکەل ئەبێ شیعرێکی داناوە کە لەوێدا مێژووی بە دنیا هاتنی شێخ ئەحمەدی تیایە وە ئەم بەیتە مێژووی هاتنە دنیاکەیتی :

---

١) شاکەل : گوندێکەلەسەر قەزای کفری یە لە ناوچەی گەرمیان شاعیر نازناوی بە ناوی شاکەل ەوەویە، مە بەستی دەرخستنی دڵسۆزی وخۆشەویستی یە بۆ ئەو شوێنەی تیا لە دایك بووەوتیایا پەروەردە بووە، لە هەندێ شیعرا نازناوی ـئەحمەدـ؛ بەڵام لەسەرەتای شیعر دانیانیا نازناوی "حەمدی بۆخۆی هەڵبژار دووە، دواجار نازناوی "شاکەلی" کرد بە نازناوی شعری وئێستاش هەر بەو ناوەوە شیعر دائەنێ.

چو میلادش زعین شین کاف جیم ‌ ‌ خداوندا بخشش از دریای عنایت را
صفاو پرتوش بخشا زلطف خود که تا گردد
.......

بەپێ ی نیوە بەیتی یەکەم مێژووی لە دایك بوونی ئەکاتە سالّی ١٣٢٢ك
لە پاش جەنگی جیهانی یەکەم شێخ محەمەد عێراق بەجێ ئەهێڵێ ئەچێتە
ناو جافەکانی ئێرانەوە ، کە ئینگلیز عێراقی داگیرکردو دەستی گرت بەسەر
عێراق دا شێخ محەمەد ئەگەڕێتەوە بۆ عێراق و لە نزیك کەلارجێگیر
ئەبێ . وە هەر لە ٢٧ ڕەمەزانی ئەو ساڵەدا کۆچی دوای ئەکات و لە
گۆڕستانی شێخ سەعید ئەنێژرێ مایەوە خوا لی خۆش بوو شێخ
سلێمان کوڕی شێخ مەحموود لە جێگاکەی، بەڵام کەریم بەگی
فەتاح بەگ ڕێ ی نادات بێتەوە شاکەل ،لە کۆتایی دا لە ناوچەی
زەنگ ئاباد دانیشتووەو لە بانی سندوق کۆچی دوایی ئەکات و تەرمە
کەی ئەبەنەوە بۆ شاکەل و لە گۆڕستانی شێخ سەعید ئەنێژرێ
وە ئەم دوو بەیتە مێژووی وەفاتەکەی دەر ئەخا :

لە پیری کاملی عەقلم قسەی تەئریخەکەی پرسی
وتی چابوك لە "اَلْحَقْنَا بِهِمْ" تێپەڕکە ئەولایە
لە "ذُرِّيَّتَهُمْ" بگرە ڕموزی ئەسڵی تەئریخی
کە تەفسیری پڕی تەبشیرە ڕەمزێکی بە مەعنایە

مايەوە سەر شێخ ئەحمەدی شاكەلی كە بڕياری دابوو نەچێتـــەوە گوندی شاكەل، وەلەوكاتەدا خوالێ خۆش بوو شێخ عەلی شـێخ مەحموود برا بچووكی شێخ سلێمان لە كەلار ئەبێت، شێخ ئەحمەد ئەم بە لا يقتر ئەزانێ كە ‌بێ بەجێ نشين، بەڵام لە پاش تەواوبوونی تەعزيە شێخ ئەحمەد ئەگەڕێتەووە بۆكەلار، وە لە پاش يەك ساڵ ئەميش ئەگەڕێتەوە بۆ شاكەل، لەو ماوەيەدا چەند پارچە شـيعری داناوە، ئيتر خەريك ئەبێت بە كاروباری ناوچەكەوەو ئيش وكاری دونيايی، تاكو بە ڕێكەوت تووشی سەماحەتی شێخ عوسمان ئەبێت لە ماڵی كەريم بەگ دا كە لە ناوەڕاستی ئەم ديوانەدا ئەمەم باس كردووە. شاعيری ناوبراو ئيستاكە دانيشتووی گوندی سەيدەيەو زۆربەی كاتی بە خواپەرستی و خزمەت كردنی خەڵكی و هەژاران و خويندنەوەی كتێبی هەمەچەشنە ئەباتە سەر، شيعرەكانی مەولەوی مەحوی و ناری و نالی ـ كاريان تێ كردووە . بەتايبەت مەولەوی تاوەگۆزی . جگە لەم ديوانی شـيعرەی، كۆمەڵە نووسراوێكی هەيە كە باسی مێژووی گەرميان ئەكات و لەچاپ نەدراوە .

شاعيری ناوبراو كاتی خۆی لە گۆڤارو ڕۆژنامە كردی يەكان دا بەرهەمی بڵاو ئەكردەوە، بەتايبەتی گۆڤاری گەلاوێژ ١٩٣٩ ـ ١٩٤٩ .

## چەند سەرنجێك

حەزم ئەکرد لێکۆڵینەوەیەکی دوورودرێژ دەربارەی ئەم دیوانە بخەمە ڕوو وە هەموو لایەنەکانی شی بکەمەوەو باری سەرنجی خۆم و هەڵوێستی مەوزووعیانەی بێ لایەن بخەمە بەر دەستتان. بەهەر حاڵ دیراسەکردنی دیوانێك ماوەیەکی زۆری ئەوێ و منیش نەم ئەویست کە پرۆژەکە دوا بکەوێ و دیارە ئەگەر دیراسەم بکردایە لە چاپ دانی دیوانەکە دوا ئەکەوت، بەهەرحاڵ وا هەندێ سەرنجی خۆم ئەخەمە ڕوو:

شاکەلی یەکێکە لەو شاعیرانەی کە بە ئاسانی جێگای خۆی لە ناو شاعیرەکان دا کردووەتەوە، وە ئەگەر بێت و تۆزێ پەیوەندی خۆی لەگەڵ بەرهەمی ئەم سەردەمەدا بەهێزترکات بەرهەمی بەهێزترو بەهێزترمان ئەخاتە بەردەست، ئەوەی شایەنی باسە کە شاکەلی لەو بابەتانەی خۆی پێوە خەریك کردووە، تیایا سەرکەوتووە، وە بەلای منەوە زۆربەی شیعرەکانی هیچی لە پلەی شاعیرەکانی تر کەمتر نیە، خۆ ئەگەر، بێت و بەراوردێك بکەین لەنێوان بەرهەمەکەی و بەرهەمی شاعیرێکی تردا بە ئاشکرا ئەمەمان بۆ ڕوون ئەبێتەوە لە هەمان کات دا توانیوێتی مەبەست بپێکێ و لە زۆر شیعریش دا ئەگەرچی

لە ڕووی زمانەو درێغی نەکردووە لە بەکارهێنانی وشەی بێگانـــە، بەتایبەت وشەی عەرەبی و فارسی، کە ئەمەش بەهۆی کارتێکردنی ئەدەبی کۆن و بیروو باوەڕی ئیسلام و فەلسەفەی سۆفیزمەکەبووە، بەڵام لە زۆر شوێنێش هەقی بۆکردووینەوەو وشەکوردی پەتی زۆر بەکارهێناوە.

بەتایبەت لە وەسفی سرووشت دا، بۆوێنە لە باسی شاکەل و شیروانەدا ئەڵێت:

بەهاران و ئێوارە دەشتی سیروان ... بباری جار بە جارە تاوی باران

بەسەر بەرگی گڵ و چڵ دا بچۆڕێ ... جلی سەرمای زستانی بگۆڕێ

جریوەی مەل لەسەر بەرگی گوڵ وگیا ... فوارەی ئاوی ڕووناکی چەم و چیا

بە جۆشێکی بە کوڵ دێنن بە بیرا ... سەفا دێنێ بەچاوی مێردە پیرا

....تاد.

یان لە شیعرێکی ترا ئەڵێت:

چبکەم نەماکەسێکە دەرمکا لە ناکەسی ... تا ماچ خاکی بەری پێی بکەم لەجێی دەسی

بەڵام وەك لەپێشەوە وتمان وشەی بێگانەشی زۆر بەکار هێناوە با لەم بەیتە وردبینەوە:

مەنبەعی حوسن و جەماڵ و تەن سیم تەنان
هەموو زیبا سەنەمێ بادەکەش و نۆش لەبە

بەلای منەوە بەکارهێنانی وشەی بێگانە نابێ بە خەوش ئەگەر بێت و

وەستایانە بەکار بهێنێ وهەموو بەرهەمەکش لەو بابەتە نەبێ
چونکە هەرچی شاعیرێکی کلاسیکی بگرین نەی توانیوە خۆی
لەم دیاردەیە ڕزگار بکا.
شتێکی ترکە جێی سەرنجە ئەوەیە کە ئەحمەد لە هەندێ شیعرا
وشەیەکی چەند جارێ دووبارە کردووەتەوەو هەریەکەشی واتایەکی
تایبەتی ئەبەخشێ بێ ئەوەی هیچ لە قیمەت و شێوەی شیعرەکەی
کەم کردبێتەوە یا ناشیرینی کردبێ:

لەرزین لە ترسی "سەرما"، ترسی نەما لە "سەرما"
برکی ئەدەم لە بەرما، بەرگی گرانی "سەرما"
بە تیشکی تاوداری هەتاوی مانگی نەورۆز
شکا شکۆهی "سەرما" بێ دەست و پاو و "سەرما"

شاکەلی و شیعری موناسەبەت:

موناسەبەت ڕۆڵێکی گەورە ئەبینێ لە ژیانی هەموو شاعیرێکدا، جا
ئەو موناسەبەتە خۆش بێ یا ناخۆش، تاڵ بێ یا شیرین هیچ لە
مەسەلەکە ناگۆڕێ، دەردی دووری لە خۆشەویست و کارەساتەکانی
ژیان و کۆچ کردن و گیروگرفتی دەروونی و... تاد. هەموویان کەرەسەیەکی
ڕەسەنن بۆ ئەوەی شاعیر نووکی خامەی بخاتە کارو کانیاوی

شیعری بتەقێ ئەم دیوانە زۆری لەم بابەتە تیایە:

"کۆچی دوایی ئەنوەری جوانەمەرگ، خنکاندنی نەسرین لە ئاوی حەوزدا، کۆچی دوایی شێخ سلێمان، دەردی دووری لە شاکەل گەشت کردن بۆ بیارەو گەڕانەوە بە دڵ شکاوی، نەخۆشی و بێ تاقەتی دەردی پیری، ... تاد." .

کەواتە شاکەلیش وەکو زۆربەی شاعیرەکانمان ئەم دیاردەیە بە ئاشکرا کاری تێ کردووە.

لە کۆتایی دا هیوادارم کە توانیبێتم کەلێنێکم لە کتێبخانەی کوردی دا پڕ کردبێتەوەو دیوانەکەی شاکەلیش بچێتە پاڵ دیوانی شاعیرەکانی ترمان.

جەمال محەمەد محەمەد ئەمین

سلێمانی ۷/۷/۱۹۷۸

۱

ڕابەری دنیاو دینم کاکا عوسمانی عەلا
چیم لە دووری دوڕوە، گەرتۆی لە سینەی شاکەلا
شاکەلی شادە بە حاڵت شاهی ئێمە تۆی ئەوێ
بۆئەوە وا ڕوو لە تۆیە کۆمەڵی سۆفی و مەلا
کۆمەڵی سۆفی و مەلا موشتاقی دەشتی شێوەتن
بوتە وافی کەعبەیی ئەبرۆیی ئەو بوون موتبەلا
موبتەلا هێچ کەس نەبێ وەك من بە داوی تەبعەوە
وەك بەلا ئالا بە پێما، پێمە زنجیری بەلا
پێمە زنجیر و ئەسیری ئارەزو و نەفس و هەوا
تا هەوا مابێ لە سەرما وام لە هەورو دووکەلا
دووکەلی جورم و قەساوەت "لاشەم"ی وا داوەشان
نووری تاعاتی نەهێشتم بۆم نەما جیلوەو جەلا
بێ جەلایە پڕ بەلایە چونکە بێ سەقفە و ستوون
تیا بمێنێتۆ ئەبینێ زیللەت و زوڵم و بەلا
لا بەلا بە "شاکەلی" لەم سینە مادا،سی نەما
سینە ماگەر سینە ما،چی مایەوە،ماوو نەما

-«« ٢ »»-

دڵ لە ناوی سینە ما بولبولــ صیفەت هاوار ئەکا
ئارە زووی غونچەی لێوو دە می دڵدار ئەکا
هەر ئەڵێ لێوو دە می جانانە غونچەی گوڵ هەنار
نەرگسی شەهلا بە شۆخی ،ئەولە چاوی یار ئەکا
گەر لەبی لەعلی شەکەر پاشی بخاتە پێکەنین
غونچە دڵ ،تۆتۆ، ئەکا تو،چاوی گوڵ خونبار ئەکا
دڵ بە غەمزەی چاوی بیماری نیگارم خەستەیە
مات و حەیرانم کە خۆی بیمارە چۆن بیمار ئەکا
رشتەیی ئەگریجەکەی بۆگرتنی من با ئەدا
گەر بڵێم زوڵفی لە میشکوعەنبەری تاتار ئەکا
چاوە نواری ڕۆینو شێوەی خەرامانی تووە
ئاسکێ شاکەل کەوا بەو لەنجەیە ڕەفتار ئەکا
دڵ ئەوەند موشتاقی شێوەی چاوی کاڵی دولبەرە
بۆیە بۆ تەعریفی چاوی شیعرەکانم سوار ئەکا
شیوەن وگریان و ئاهی بولبولی سەد پارە دل
هەر لە ناڵەی «ئەحمەد»ی بێ تاقەت و زامار ئەکا

﴿ ٣ ﴾

لە رزین لە ترسی سەرما ترسی نەما لە سەرما
بزکی ئەدەم لە بەرما ، بەرگی گرانی سەرما[١]
بە تیشکی تاوداری هەتاوی مانگی نەورۆز
شکا شکۆهی سەرما بێ دەست و پاوو سەرما
چەمەن چە ئاوداره پۆپەی چیا بە هاره
نزاری لا لەزاره سەرما بەبێ ئەسەرما
ئێستاکە میوە داره ، سایەی سەری هەژاره
ئەوداره والە سەرما بێ سێبەرو سەمەرما
بە زاق زیق لە دارا گەیاندی یە بەهاره
باڵندە بێچووەکانی لە کۆشی گەرم و نەرما
لە روی گوڵا بریسکی شەونم لە ڕۆژهەڵاتا
وەك کولمی ئالی یاره عەرەق بکا لە شەرما
چەجوانی ووت بە بولبول گوڵ بە نازو ڕازەوە
دراوە بەرگی ئالم بە نازکی لە بەرما
ئەی بادەکەی[٢] نەسیمی صوبحی بەهاری تازە
بووژانەوەی ژیانم بە تۆیە بێ بە سەرما

به تیشکی تاوداری ڕۆژی درێژو گەرمت
ئازادو سەربەخۆم کا لە زۆری کۆتی سەرما
شیفا تەقدیم کا ئازیز لە موستەشفای مەولانا
بەلوتفی خوا لە سەرما ، نەمانی ئێش لە سەرتانا

١- برکی ئەدەم : تووری ئەدەم : فڕێی ئەدەم.
٢- بادەکەی: سروکەی.

٤ (١)

هەر ئەبێ ڕۆژێ « بعون الله » لە عەینی ڕەحمەتا
خۆت بشۆری لەم هەموو گەردی هیلاکی و مەینەتا
شاکەلی ئێوە ئەبینم پڕ لە ئاو فەیض و ئیمان
دێتە میوانت « بحول الله » شاهی عوسمانی جیهان

١- شاعیر ئەم چەند بەیتەی لە ١٠ ڕەمەزانی ١٣٨٩ك وتووە ئەمەشی بەدەم ئێش و ئازارەوە وتوو بە بیخودی وەکو یەکێ بێ ی بلێ.

## ٥

### بۆ حەمەی شێخ سلێمان لەکەربەلا

شاکەل م نایە بە بیرا، هام لە بیری کەربەلا
چاوەکانم دوو فورا ن، بۆ ئە سیری کەربەلا
مددەتی ساڵێکە خۆمن چاو لە ڕێگەی کەربەلا
بۆ نەجاتی بێگوناهان و فقیری کەربەلا
دەشتی شاکەل تەنگو تاڵە هەروەکو زیندانە لام
تالە گوێما بێ دەنگی بێ نالەو نە فیری کەربەلا
زور دەمیکی کۆنە ئێمەو کەربەلا جێگەی غەمین
هەر لە ناسۆرایە زامی جێگە تیری کەربەلا
دەشتی شاکەل کەربەلا بۆ ئالی محمود ئال وبەیت
بێ خەتابوو چوونە سیجن وکۆنە گیری کەربەلا
شینو شۆڕی کەربەلایە، چاوەکەم خوێناوی یە
هەروەکو شیعە لە شینا بۆ ئەمیری کەربەلا
شەرتە تامردن لە بیرم بێ زویری ئەو دەمە
وا حەمەی تێچوو بە زۆری بۆ زویری کەربەلا

چاوە نواری لوتفی تۆم دەرکا لە جیسمم لەرزو تا
چاوە ڕێی قاپی عەیادەم پێ نەکەی "رب العلی"
سوجدەیی شوکرت بکەم تۆبـــەو ئەنابەت پیشەکەم
ڕوو لە قاپی تۆبکەم، پشت کەم لە بابی بێ وەفا
مۆڵەتێ خاسم نەکێڵا لەم ژیـانـا مـوددەتـێ
بەڵکە تەرکی مەعیشەت کەم ڕوو لە تۆکەم بێ ڕیـا
ڕووکەمە خاکی حیجازو مەککەو ڕەوضەی نەبی
دڵ ئەمینم ئەو دەمە فەرمووتـە "کـان آمنـا"
گەر نەسیمی هاتەوە، خو لوتفی تۆیە باریـــلا
وەر نەمردن خۆشترە لەو جێگە پاکی باســـەفا
تۆ "مجیب" ومن موناجاتـم گەیاننــە بارەگـا
زۆر ئەمەل دارم ئیجابەت کەی بە لطف وکبریـا
شاکەلی پێویستە ئەمجا حەق بناسی حەق بڵێ ی
گەر وەها بی پیت ئەبەخشێ "مطلقا" ئەمجا شیفا

### ٧

سۆزی تۆیە پڕ بە سینەم تاقەتی سازم نەما
دەردی دووری پیری کردم شێوەیی نازم نەما
گەنج ی گەنجی بوو بە ڕەنجی ژینی ڕۆژی ئاخرم
تازە ڕەوتی شێخمە، چون هێزی سێبازم نەما
داڕزا ئەجزایی زەوقم ، چەرخی شەوقم ناگەڕێ
وەك مەکینەی ئاشی حاجی جێگەیی گازم نەما
دوور لە تۆ دەوڵەتمەنی ئیمساڵە هێزی لێ بڕا
هەردوو وەك یەك تێشکا، ئەوهێزومن نازم نەما
حەیفە باسی ماڵی دنیا من کە خۆم بۆ ڕۆینم
ئاشکارم ئاشنایە ئارەزووی ڕازم نەما
گەر نەجاتم بوولە سەرما زۆر زەرورە هاتنم
کە وتووم لەم دەشتە جاری هێزی هەورازم نەما
ئەم دوسێ شیعرەش کە ئەیڵێم بۆمەزەی زەوقی تووە
کاکە حاجی زەوقی چی من شەوقی دڵخوازم نەما
شۆرە زارە خاکی شاکەل بۆیە شۆرن شیعرەکان
ئاخری ساڵە دەچی بکەم بیبە روپیازم نەما

تالەکەللەمدا شنەی نەشئەی نەشاتی شاکەلە
ئارەزووی سەیرانی شاروشەوقی شیرازم نەما

٨

لەچاومدا پەیەندەرپەی هەزاران دەرهەزار ئەڕوا
سروشکی ئاڵی گوڵ ڕەنگم وەکو تاوی بەهار ئەڕوا
ئەبارێ لوئلوئی لالە، لە بۆنیثاری[1] ئەو بالاّ
لە شیعرم گەوهەری والاّ قیطار ئەندەر قیطار ئەڕوا
لەچاوانم تکەی ئەسرین شەبیهی کۆمەڵی پەروین
بە یادی ماهی دڵ سەنگین[2] هەمیشە وەك سەیار ئەڕوا
عەجەب ماوم لە ئەو بالاّچە خۆش هەڵسا لە دووسالاّ
لە هەڵچوونا قەدی ڕەعنا وەکو سەرو وچنار ئەڕوا
وەکو شەونم لە چاوانم لە هیجری ماهی تابانم
ئەلێی لە علی بەدئەفشانە[3] لە بۆ ئیثاری یار ئەڕوا
بە تەحویلاتی ئەمچەرخە مەچەرخە وخۆت مەڕەنجێنە
کە ئاڵووگۆڕی هەر ساڵێ وەکوو پێرارو پار ئەڕوا

١- نیثار: پێشکەش کردن.
٢- دڵ سەنگین: دڵ ڕەق، بێ رەحم.
٣- بەدئەفشان: پەخش و بلاّو.

### ٩

شفیع المذنبین رەحمت مەگەر بۆ ئێمە چارێ کا
وە یا نائیب مەنابیکت عیلاجی زامدارێ کا
خودا بەم شاهە بمبەخشە کە ناوی ڕەونەقی عەرشە
لەگەڵ ناوی خوتا نەقشە لە لەوحی بەرقەدارێکا
حەبیبی تۆیە ناوی ئەو، کە چون مەحبووبی بێچوونە
دە بمبەخشە بەبێ چوونی لە ڕێ ی عالی شیعارێکا
لەبەر ئەولادو ئەصحابی لەبەر ئەحبابی ئەنجابی
لەبەر نائیب مەنابێکی لە ڕێگەی یاری غارێکا
لە دەشتی غەفلەتا دیل و لە کێوی حەسرتا وێڵم
دەلیلێ بۆ زەلیلیی دڵ مەگەر ئەو یارە چارێ کا
لە دەس نەفس و هەوا شێتمە لە دەس دێوێکی مەلعونێ
مەگەر هەر خوا دەری بینێ لە ناو خوێن و دەمارێکا
لە گۆڕی تەنگو تاریکا، لە ڕێگەی سەخت و باریکا
لە ترسی ژارمارێکا، مەگەر هەر لوتفی یاری کا
نەجاتم بێ لە تاریکی، خەلاسم بێ لە باریکی
نەچێژم ژارمارێکی لە شکڵی سووس مارێکا

ئەسیری نەفسی ئەمارەم زەلیلی دێوی مەککارەم
هەوا سووتانمی چارەم مەگەر ئەو شاهە چارێ کا
بوەخشە موجریمی ئوممەت، مەپرسە قیللەتووکیسرەت
منیش دەرچم بە ئازادی لە ڕیزی خاکسارێکا
نەماوە، بۆخوادۆزی، مەجالی شاکەلی، سۆزی
چی یەجواوی[1] سەرئەفرازی[2] لە بەینی بەردوغاریکا

١- جواو: وەلام.

٢- سەرئەفراز: سەرفراز: چارە سەر، سەرکەوتووی.

وەتەن گەربێ - دەبیری - پیری خۆی بێ
فەقیری چاوە نواری میری خۆی بێ
لە بیری میری ژیرابێ فەقیری
لە دلیا دەرنەچێ پیرویە سیری
چە خوشە ئەوحەلە ئەو نێشتمانە
بلێ ژینی وەها ناوی ژیانە

۱۰

ئەم پارچە هەڵبەستەی بە هۆی زیارەت
ودیدنی سەماحەتی پیرلەمحمود ئاوا لە ۱۲ ربیع الأول ۱۳۸٦ك
داناوە کە شوێنێکی خۆش و دڵگیرە

وەکوکۆشکی بەهەشتم هاتە چاوا
مەقامی شێخی ئیمە مەحموود ئاوا
شەوی وەك ڕۆژە، جەژنە ڕۆژی
هەموو نەشئەو سرورە، تا خوراوا
لە قەسرو باغی جەننەت وێنەی کە
خودا مەعموری کا، مەحموود ئاوا
وەکوو جەننەت وەهایە ژێری ڕووبار
پەلوپۆ سەوزو بنجی وا لە ئاوا
مەپرسە سەیری سەروو سێبەرو بەر
نەمێنێ باسی لوبنانت لە ناوا
شوکر مەحموودە تەخت و بەختی عوسمانی
درەخشانە وەکوو بەدری سەماوا
خودا ئەم بەدری تابانە عەزیزە
لە ئیسلاما بمێنێ هەر لە ناوا
گەرەکتە شاکەلی چاوێکی ڕووناك
لە خاکی مەحموودە ئاوا بێنە چاوا

-- ١١ --

شاعیر سەفەرێ کە چووە بۆچاوپێکەوتنی نەزەرگەی حەزرەتی شێخ حەسەنی قەرچێوار خوالێی خۆشنوودبێ تاوێ بێ دەنگ ئەبێ ئەم مەعنایانە بەخەیالیا دێت و دەبنە مەزەی ئەم هۆنراویەکەلە ١٩ شەعبانی ١٣٩٢ ك بەامبەر ٢٨ ایلول ١٩٧٢ ز بووە

ئەی قوبەیی سەوزو سپی ئارامگاهی ئەولیا
پرتەوی نوورت ئەگاتە بارەگاهی کبریا
گونبدی قەسری جینانی یا مەتافی موقعی
سایەیی عەرشی خودایی یا مەکانی ئەسفیا
فەیزوو ئیحسان و فەزیلەت لازمی دەرگاکەتە
هەروەکو بۆچاوی مەعنا گەردی ڕێگەت تووتیا[1]
مەرکەزێ ئەقتاب و قوببەی ئەهلی ئەسراری زەمان
شاهیدی تەعریفی تۆیە نەقشی فەرشی بۆریا[2]
گەرکەسێ دەستی بگاتە پایەیی ئەیوانەکەت
وا ئەزانێ جەننەتەو هەروا ئەمێنێتۆ تیا

١- تووتیا : دەرمانێکە بۆچاوێ ئێشە. پاك کردنەوەی مس بەکاری دینی.

٢- بوریا : حەسیر

بۆمسی مەغشووشی قەلبێ وەك منی بێ ئابڕوو
خاکوخۆلی ئاستانەت چاترینی کیمیا
هەرکە دەستم گەییە پەردەکەی سەرمەرقەدێت
لەو دەمە دڵ کەوتە ناڵەو ذیکرو فیکری ئەتقیا
ئەم دەقیقەی خستە بیرم پیری قوببەو بارەگا
شاکەلی شێوە یەکێکە شەمسی دینێ بێ یاضیا

۱۲

ئەم غەزەلە شیرین وجوانە پارانەوە یە لە پیرانی تەریقەت

| | |
|---|---|
| نەچمە خانەقای دوو ڕۆی عوسمانی | نەبمە پەروانەی لۆکسی ئیمانی |
| دڵ نوسووتێنم بەو شوعلە گەرمە | ئارنەی سوتێنێ،ئەم لاشە نەرمە |
| یا نەبمە بولبول بۆغونچە لێوێ | نەگریم وچاوم،ئاوێ نە پێوێ |
| ئەشکی حەسرەتم،لە ئاخر ساتا | ئەڕژێ و بێ سوودە لەو دەم وکاتا |
| یا نەبمە تووتی لەو شەکرسانە | شەربەت نەنۆشیم،وە بێ پێوانە |
| ئەبێ وەك مەگەس بیدەم وسەرما | دەستی سواوی ئەسەف لەشەرما |
| یا وەکو قومری تەوقی عیبادەت | نەیکە مەگەردن لەرێی سەعادەت |
| بەپەیرەوی ڕووی عوسمانی زانا | زانا بە عیلم وقەلب وتەوانا |
| ئەسیرو بەندەی سەیروهەوا بم | لە هەردو سەرا هەرێ مەئوابم |

شەمعی جەمعی یارانی گیانی ... خۆت نەسووتێنی شەو تا بەیانی
سەرتاپای وجود بتاوێتەوە ... گریان جەریمەی بشارێتەوە
وەك زیوی خالیس دەچی لەبۆتە ... کاتی تەوبەیە بۆمن ووتووتە[1]
ئەوسا تەواوە عیشقی عوسمانی ... لایق وە زومرەی مەجلیس ئەوانی
ئەرنا ئالوودەی وەك تۆپڕ خەتا ... مەیلی مەجلیسی ئەوانت خەتا
شاکەلی شێوەت گریان وشینە ... وە دەردی دووری دڵت برینە
وەك تەم و هەورە بوخاری سینە ... بێ شەوقیم دووری سراجەدینە

١- بۆتە : کاسەیێ کەکە زیری یێتا ئەتوێننەوە.
تۆ : من [ مەبەست لە شاعیر ].

-- ١٣ --

## غەزەل بو حەمە

حەمەلەتەمەنی یانزە سالیا لە پۆلی یەکەم لە ناوەندی کفری ئەی خوێند لە وێوە لەتەك کەریمی هاوڕێ یا چوو بوون بۆ یادگاری وێنەیەك ئەگرن شاکەلیش لەژێر وێنەکەیا ئەم چوارینەیە دائەنێ:

سیمای ئەم وێنە هەسێرەی سەما ... بە جیلوەی جوانی هێنایە سەما[1]
بەڵێ منالێ یانزە سالەیە ... پایەی دانشی زۆرە لەکەما[2]
لەخوێنگای دووەم پۆلی یەکەمە ... ڕەوشەنی چاوو پلەی هاودەمە
پێشەوای تازەی خوێندنی تازە ... نەوەی شاکەلی شێخ کاکەحەمە

پێشەوای بەشەو برای خۆیەتی ... بۆیە بۆ خوێندن کن و کۆیەتی

منالی شاکەل، بەڵ، چاوی لێکەن ... هەولۆکۆششی بێ منو تۆیەتی[3]

مەحفوز بێ خوا لەگەڵ هاوپایا ... پیرێکی وەك من بژی لە سایا

ئەولیش لە سـای ئالآی ئەحمەدی ... بژی بە شادی لەگەڵ برایا

١- هەسێرەی سەما: ئەسێرەی ئاسمان هێنایە هەلپەرکێ

٢- دانشی: زانستێ.

٣- بەل: بەڵکو. من تۆیەتی: بێ جیاوازی.

## ١٤

ئەی دەردی گرانم کە چە بێ یـارە بیـارە

چاوم لـە تەما کـەیلەکە نادیارە بیـارە

کوا بەرقی تەوەجوەکە گلۆپی دڵی تـارە

کوا جەزبەی سـوفی لە چە بـێزارە بیـارە

کوا مەجلیسی پەندو ئەدەب و دەئبی بوزرگان

حیرەت زەدەیە بێ دەم و گوفتـارە بیـارە[1]

کوا رێزی بە رێزی ئەدەب و عیلمی مەلاکان

رازێکی نیهانـە کـە دلازارە بیـارە

ئەی پادشـەهی مەملەکەتی عیلم و مەعانی

بێ تۆیـە، لە بۆتۆیـەکە سەرشارە بیـارە

بێ شۆرشی نیوەی شەوەو بێ زیکرو بەیانــە
جارێ بە تەمەنایێکەوە بنــوارە بیـــارە
درکە لە دڵاعیجزی عێراقت لە فیراقت
نێزیکە لە سووتانەوە ئەمجارە بیـارە
بێ تۆیـە، لە بۆ تۆیـە، کە تۆ تۆیـە ئەناڵێ
پڕیە لە مەراق و ئەسەفی سەف سەفی ئەویارە بیارە
مەعلوومەکە ئێستەش پڕی گەنجەلە نهێنی
شایانە بڵێم مەنبەعی ئەسرارە بیـارە[٢]
وەک دووکەڵی کوورەی دڵەکەی شاکەلی وایە
خەمباری تەمی دووری دڵـدارە بیـارە

١- حیرەت زەدە : تووشی سەرسوورمان بووە.

٢- مەنبەعی ئەسرار: سرچاوەی نهینی.

-- ١٥ --

لە ساڵی ١٩٤٧ز- دا لە کۆتایی مانگی مایس دا لە پاش ئێوارە لەکاتی گەڕانەوە لە ماڵی شەوکەت بەگەوە بەرەو ماڵی خۆمان وە لـە کاتی نان خواردن دا دەنگی قورئان خوێنێکی خۆش دای بەگوێما دڵ و هەستی جوڵانم، کە پرسیارم کرد و تیان شێخ عوسمان تەشریفی هیناوە والە ماڵی کەریم بەگ، ئیتر نەوێسام وهەڵسام

چووم بۆ زیارەتی ڕێکەوت بە رامبەری دانیشتم هەر لەڕاسیا زۆری پێ نەچوو محەببەتێکی چووە دڵمەوە، وە ئەتوانم بنووسم کە مەسیری دنیایم گۆڕا، بەڵام موعارەفە نەبێ بەهۆی کەریم بەگەوە قسەو باسێکی وا نەچووە بەینمانەوە بۆ بەیانیش دووبارە ئەچووینە ـ کومار ـ کە ناوچەیەکە لە ـ قەرەبلاغ ـ لە قەزای ـ کفری ـ چووینە خزمەتی جەوازمان خواست فەرمووی تۆیش ئەچی عەرزم کرد بەڵێ، فەرموویان موبارەکە بەڵام تێگەیشتم حەزی ئەکرد لەلای بم لەگەڵ ئەوەش دا ڕۆیشتم پاش هاتنەوەمان ئەوچوو بوو بۆ «قزرابات» منیش چووم بولایان لە خانەقای شێخ عارفا بوون، دەرکەوت بەچوونم مەسروور بوو، پاش میقدارێ عەرزم کرد، شەکواو دەردێکی دووروو درێژم هەیە، تەشریفی هەڵسا بۆ خانەقاو لە میحرابەکەدا دانیشت ومنیش شەکوای شاکەل و دەردی دڵی خۆم بۆ هەڵڕشت، ئیتر دەرکەوت تەئسیری بووە چەن کەلیمەیێکیان فەرموو، ئەوە بوو بچم بۆ بیارە لە پاش یەک دوو شەو ئیجازەی گەڕانەوەی دام، خۆی مایەوە بۆ خانەقی و بەغدا ئەچوون، ئەمجا عەزمی سەفەری بیارە قەراری قەتعی بوو، بەڵام داخی گرانم لە خۆشیا ئەوە ندە

زووچووم ئەو نەهاتبووەوە ، تەنها شێخ عەلادینم زیارەت کرد گەڕامەوە ئەم پارچە هەڵبەستەم بە سوورەتی شکات پێشکەش کرد ، هەرچەندە ئەم قسەو باسانە لەم ڕۆژانەدا تامێکی وای نەماوە بەڵام بەلای منەوە ئەم باسانە بە موسبەتی هاوشانی دینی حەنیفی ئیسلامەتی یە، تائەو شەوکەت و شکۆهی بێ ئەم باسانەش لە شەوقایە، بە تایبەت ئەم سەرگوزشتەیە ڕووناکی یەکەی دای بەچاوی خۆماوە ئەمە پارچە هەڵبەستەکەیە:

ئەی چرای شەوقی جەماڵت شەمعی حوجرەی سینەکەم
دینەکەت ئاوی ڕەوانی مەزرەعەی ئایینەکەم
مەزرەعەی ئایینی تاعەت کاتی نەورۆزەو کزە
مەرحەمەت کە ڕوو لە من بە ئاوی دین و ژینەکەم
ژینەکەم قوربانی تۆیە بۆ درێژی ژینی تۆ
حازرم قوربان فیداکەم ڕۆحەکەی شیرینەکەم
ڕۆحەکەی شیرینەکەم هەرچاوەچاوی ڕێگەتە
حازرم شاها بە برژانگ ڕێگەکەت بە ڕژێن ئەکەم
ڕێگەکەت پە ڕژێن ئەکەم تا شاکەل و شیروانە بۆت
حەیفە بۆچی تۆ نەیبینی دەشتە سەوزو شینەکەم

شینەکەم بۆ شاکەلی کەم زارو ئاوە، شـــوورەزار
شاکەلی قوربانی تۆ بێ شێخەکەی نەقشینەکەم
شێخەکەی نەقشینەکەم قوربانی تۆ بێ ژینـەکـەم
حازری ئەفکاری تۆ بووم بۆ ویقایەی دینەکەم
بۆ ویقایەی دینی من دووروو نزیکت بۆنی یە
کارە بابێکە نیگاهت بۆ سەوادی سینەکەم
سینەکەی پڕ مەینەتم، خوم خانە یەکی قەسوەتە[1]
سەفوەتی تۆ مەر بمالێ قەسوتە دێرینەکەم
قەسوەتە دێرینەکەم ڕیشەی لەدڵما داکوتا
گەر بژارێکی نەبێ فەوتاوە زەرعی دینەکەم
دینەکەم مەربووتی[2] یادی ڕابیتەی حوسنی تۆیە
حوسنی تۆیە نووری دیدەی پڕ تەم و ئەسرینەکەم
پڕ نمی دووریتە دیدەم گەر ڕچی دووریت بۆنی یە
ئەی فیدای دووروو نزیکت ڕۆحەکەی بێ تینەکەم
ڕۆحەکەی بێ تینەکەم دووبارە عەرزی تۆ ئەکا
شاکەلی قوربانی تۆ بێ، شێخەکەی نەقشینەکەم

١ـ قەسوەت: بێ ڕەحمی.
٢ـ مەربووتی: بەستراوی.

٣ـ ڕابیتە : بە شێکە لە ئادابی تەریقەتی نەقشبەندی بەوەی بە چۆکا دائە نیشن وچاو لێك ئەنێن و بەخەیاڵ وینەی مورشیدەکەیان ئەخەنە بەردەمیان و داوای بەرەکەتی لێ ئەکەن.

## وەڵامی سەماحەتی شێخ عوسمان

١٦

گەرچی دوورە ڕێگە جێگەت هەر لە دڵ دا وازئەکەم
یادو فکرت بۆ ئەدیبی شەوقی دڵ هەمراز ئەکەم
نەزمی خۆش و شۆخ و شیرینت فەرەح بەخشی دڵە
شاکەلیش فەزڵی هەزار جارە بە سەر شیرازکەم
بۆ تەماشای شاکەل و شیروانە ئازیز فکری خۆم
هەروەکو تەیارە بۆ ئەوجی سەما پەرواز ئەکەم
بۆ تەمەنای حیفزو حسنی شاکەلی گریانمە[١]
ڕوو لەقاپی حەق بە دڵ دەستی دوعا هەورازئەکەم[٢]

١ـ حیفز : حفظ ، پارێزگاری.

٢ـ هەورازئەکەم : بەرز ئەکەمەوە.

١٧

حاجی لە پاش کەعبە ڕووکە لە شاری دولبەر
تا سەرفرازو بێ غەم ڕووکەی لە دەشتی مەحشەر
حیرەت ئەکەم لەوانە ئەچنە تەوافی خانە

نارۆنە ئاستانەی" خیرالوری" ی پەیەمبەر
گەر خواهیشت خودایە، لەم عەمرەوو سەفایە
مەقسوودت مستەفایە، خالق لەحەجی ئەکبەر
"لولاكَ" وهەم" لعمرك" دووشاهیدن تەبەرولك
بەس بۆ جەنابی ئەو بوو ئەوەی کرا موقەددەر
رووکە لەرێ ی مەدینە رێگایّ تو مەبینە
ئەم رێگە رەسمی دینە گەر پێم ئەکەی تۆ باوەر
بە سۆزی پرلە سینە ئاهێ لە دڵ دەرێنە
دەروونت هەڵگرینێ خۆشتر لە ناری مەجمەر
ئەم مانگە تەرکی خەوکە، بەشەولەخەوتۆرەوکە
دڵ پرلە شەوقی ئەوکە دەمت الله أکبر
کە چوویتە ماڵی مەکە، عەزمی مەدینە جەمکە
تەحقیقی دینی تیایە مەدینەیی منەووەر
گەرلە فزوگەر مەکانی دیقەت کە تۆ نیهانی
دینی موبینی تیایە ئەسڵ لەوایە موغمەر
یەعنی شەفیعی مەحشەر نووری خودا پەیەمبەر
ئەرزو سەما موسەبب بۆ ئەوکرا مسەووەر

قەسری بەهەشتی هەشتی گوڵزارو باغ و دەشتی
تەرکیب کرا سرووشتی بۆ ئەو بوو هاتە مەنزەر
"أسرى" هەتاکو"أقصى"، "والنجم" تا"أو أدنى"[1]
مەولا گەیشتە مەولا دوو شاهیدن موسەددەر
کەمتر لەچەن دەقیقە، ئەم چوونە چەن دەقیقە
بێ قووەتی نەتیقە، عاشیق گەیشتە دلبەر
حیجابی بۆ کراوە، بیستی و وتی و گەڕاوە
ئەمرو نەهی هێناوە، لە ژووری چەرخی ئەخزەر
سوبحانە لەم وسوولە، بێ قالوو بێ مەقوولە
ساکیت" ذوي العقول"ە، رغبەن بەحوکمی باوەڕ
نووح وخەلیل و ئادەم کەلیم و ئیبنی مەریەم
مات و مەلوول و دەرهەم بێ تاقەتن لە مەحشەر
ئەو ڕۆژی پڕ بەڵایە، بۆکێ ڕجا ڕەوایە
مەر ساحێبی لیوا بێ ئەحمەد بە ئەمری داوەر
عالەم لە حیرەتایە، بەس نازی تۆ ڕەوایە
فەرموو شفاعەتێ کە بۆعالەمی موقەسەر
هەرکەس خەریکی خۆیە عاسی پەنای بوتۆیە

تابیع بە شەرعی تۆ بووین سەد کە سیاهە دەفتەر

"نعمائه العمیمه"، بۆ عاشیقانی موخلیس[2]

"عذابه الالیمە"، بۆ جاحیدانی ئەبتەر

خوسرانی جاویدانی، بۆ مونکیرانی سوحبەت

ڕیزوانی بێ نیهایەت بو یارو تەبعی یاوەر

مەشرووبی مونکیرانی شوربی حەمیم و هیمە

مەخسووسی موخلیسانی شەراب وئاوی کەوسەر

هەرچەندە ڕووسیاهم مەحجووب و پڕگوناهم

لایەق بە عفووی شاهم عاسی و موقیرو موزتەر

بم بەخشە یا ئیلاهی بە فەیزی سوبحگاهی

شادان نەبێ بە یەئسم ئیبلیسی پیسی ئەعوەر

یاڕەب بە لوتف و ڕەحمەت بمخەیتە بەر شفاعەت

ئەحمەد بنێرە کەعبەو بو ڕەوزەی موتەهەر

۱ـ مەبەست لە "أسری": شەو ڕۆیشتنە لە مزگەوتی مەککە بۆ مزگەوتی شام هەروەکو خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: [ سبحان الذي أسرئ بعبده لیلا من المسجد الحرام الی المسجد الأقصیٰ ].

وەلەوێوە "میعراج" دەست پێ ئەکا.

"والنجم" مەبەست لە سوورەتی [ النجم ] کە بە دووروو درێژی باسی بەسەرهاتی میعراج ئەکا.

۲ـ نعمائه العمیمه: نیعمەتە زۆرەکانی.

یا رسول الله ئەگەرچی ڕوورەشی دیوانی تۆم
گەر نەبم خۆ هێچ نەبی ڕیزەخۆری خوانی تۆم
سەهووە، ئاما قوولی یە خۆم کردە کەلبی کوی تۆ
چۆن سەگێکی پاسەوانی موخلیسی ئاسانی تۆم
لەو سەگی ئەسحابی کەهفە من ئومێدم زیاترە
بۆ ئەوە من توولە هەڵتووتا وەکەی دەربانی تۆم
من کە ڕوو زەردو زەعیف و زامداری غەفلەتم
ناتەواوم، نارەوایە، چۆن بڵێم قوربانی تۆم
تۆ ڕەئوف و مونعیم و من موفلیس و بێ زادی ڕێ
ڕێبوارێکی هیلاکم هەر ئەڵێم میوانی تۆم
ئەی شەفیعی موزنبین موحتاجی شێوی ئەم شەوم
بێ دەس و بێ کەس ئەمێنم چاو لە ڕێی ئیحسانی تۆم
یا رسول الله چە خۆشە سەر قەدەم کەم تا حزوور
گەر بژیم دووبارە ژین و بشمرم قوربانی تۆم
کەس نی یە وەک من لە دەشتی غەفڵەتا وێڵ و مەلوول
ڕووڕەشی ڕۆژی جەزام و شەرمنەی یارانی تۆم

ئەی فیدای ئەو خاکە بم ئەسحابی تۆ پێ یا ئەچوو
گیان فیدای سدیق و فارووق و عەلی و عوسمانی تۆم
ئاخ لە داخی کاخی جەهلاحەپسی تاریکەی خەتام
چاوە چاوی نووری عیلم و پرتەوی عیرفانی تۆم
تو خودا ڕۆژی جەزا کاتی ڕجا ئەی مولتەجا[1]
شاکەلی بێ بەش مەکە حەیفە کە سەرگەردانی تۆم

١- ڕۆژی جەزا: ئەو ڕۆژەی هەرکەسە لە کردەوەی ئەپرسنەوە ڕۆژی قیامەت.

## شاعیر ئەم شعرەی لە کاتی نەخۆشی دا وتووە

### ١٩

ئەی وەتەن ئەمجارە حەقمە ڕوو لە ڕێی مەولا بکەم[1]
گەر لە ڕاسی لێم ئەپرسی تەرکی تۆو دنیا بکەم[2]
بێ سەفایە، سوود و سەرمایەی نییە[3]
گەر خودا یاری بدا با تەرکی ئەم سەودا بکەم
یا رسول الله لە دنیا حاسڵ و مایەم نەدی
هیمەتێ بەڵکە بە ڕاسی ڕوو لە ڕێی عوقبا بکەم
ڕوو لە ڕێی باغی مەدینە و شێتی شاخی مەکە بم

بشمرم چەن خۆشە سەیری یە سریب و بە تحا بکەم
لە شکری تالآنی ڕۆحن تیپ و فەوجی مووی سپی
جاکەوایە چاك وایە مەنزلی بینـا بکـەم
دەستی من داوێنی شـاهی نەقشـبەندو قادری
نەقشی تەوحیدیٚ لە لەوحی سینەما ئینشا بکەم
عشـقی ئەو نەقشە بە نەوعی سەوقی شەوقم کاکەوا
بۆ نەجاحی ڕێی سەعادەت شۆرشیٚ بەرپا بکەم
دەس لە دنیا بەربدەم تەرکی عەلایقی پیشەکەم
من لەمەولا پشت بە مەولا ڕوو لە ڕێی ئەولا بکەم
شاکەلی عەیبە لە دیوانی خـودا حیلەودرۆ
بۆ ڕیـایە، بۆحسیر داخستنیٚ، دڵ وا بکەم[٤]

١ـ مەولا : خوا ، گورە
٢ـ تەرك : وازلیٚ هێنان .
٣ـ بی سەفایە : پاك تیە .
٤ـ وابکەم : بیکە مەوە بازی بکەم .

-- ٢٠ --

لە پاش وەفاتی شێخ عەلادین شاعیر ئەم شیعرەی بۆسەماحەتی حەزرەتی شێخ عوسمان نـاردووە .

جێگە داری ئالی عوسمان تۆی سیراجەدینی من

هەڵبژێرواوی دەس و بازووی عەلائەدینی من
شێخەکەی دەسگیرەکەم، تدبیرو پیرو میرەکەم
دەردی دووری تۆیە بۆیە زەردو شینە ژینی من
حازری فەرمانی تۆیە خاترە غەمبارکەم
چاوەڕوانی نامەیەکە چاوەکەی بێ تینی من
خۆ لەبەر جەوری جیایی ئاو لە چاوم جاری یە
مانیعە بۆ سەیری نامەت جۆگەیی ئەسرینی من
شەرحی شەوقت نادرێ دەردی فیراقت کاری یە
هێچ نەشاتی تیا نەماوە سینەیی غەمگینی من
بوو بە خوێن و هات بە چاوا دل لەبەر زامی فیراق
وەك تکەی ئەسرینەکانم کەوتە سەر داوێنی من
گەر لە ئەحواڵم ئەپرسی گەرمە شینی ژینمە
وا لە دووریت هاتە ئاخر ژینی بێ یاسینی من
سەوزو سووری تیا نەماوە شینە دەشت وهەردمان
دوور لە تۆ هەر شینە شێوەی ژینی بێ پەر ژینی من
شاکەلی هەر چاوەچاوی ڕۆژی وەسڵی ئەسڵی یە
بۆیە جارێ دەرنەچووگە ڕۆحەکەی شیرینی من

١ـ شیخ عەلادین لە ١٨٥٤ لە دایک بووەو لە ١٩٥٠ وەفاتی کردووەو لە بیارە نێژراوە.

## ٢١

بۆشێخ عوسمانی سیری لە قەزای چوارتا کەلە ١٩٥٧/٣/٢٦ لە خزمەت شێخ عوسمانی بیارەدا هاتبوون بۆکفری و شەوێ لە سەیدە بوون، کاغەزی نووسی بووبەیانی خوش سەفەری گەرمیانیان بەتایبە شاکەل، داوای غەزەلێکی کردبوو، ئەمەش غەزەلەکەیە

ئاسمانی شاکەل ئیستەش هەرخەریکی زاری یە
بۆ ویسالی ئێوە وەک من شین و نالین کاری یە
تاوی بارانی وەکو لافاوی چاوم جاری یە
بەرقی سینەی وەک هەناسەم کوورەیەکی ناری یە
ناڵەوگریان وگرمەی شەو هەموو شەوتاسەحەر
دەردی دووری چەشتووە وەک من کەوا هاواری یە
خۆلەبەرخویناوی گریانی من و هەوری بەهار
ڕەنگی دەشتی شاکەل ئێستە ئاڵێکی گوڵناری یە
من بەهارم وا نەدیوە قەت لە دەشتی گەرمیان
لوتفی شێخی ئێوەو ئێوەی مەگەر تیا باری یە
هێندە بارانی کەرەم باری لە دەشت و هەردیا

هەر پە لێکی دجلەیەکەو ئاوی گەوهەر باری یە
شەرحی زۆری حاسیلات و بەزم و کەیفی نادری
وا ئەزانم ئەم نیسانە لوئلوئی لێ باری یە
ئەم هەموو خێرەکە واریدبوو لە دەشتی گەرمیان
خاترانەی شێخ عوسمانەو ~~هەم~~ خەلاتی باری یە
ئەم دوو سێ بەیتە تەواو ناکەن بەیانی شەوقتان
بابەکورتی بۆت بنووسم دەردی دووریت کاری یە
شاکەلی شەوقی دەروونی ئێستە فکری ئێوە یە
بێ خەیاڵی ئێوە ژانە ژینەکەی بێ عاری یە

٢٢

لە پاش ١٤ تشرینی ١٩٥٨ کە لە بیارە دەرچووم (لێرەدا قسەکانی شاکەلی لەزمانی خۆیەوە وەرگیراوە) تاکو ئێشتەکە تشرینی دووەمی ١٩٦٢ بە خزمەتی سەماحەتی پیر نەگەیشتووم چونکە دوور بوولێمەوە جا شەوقی حزووروو ناتەوانی ئەم پارچە شیعرەی بێ هەڵبەستم وە پاش ئەم غەزەلەش تا ماوەیکی زۆر بە خزمەتی نەگەیشتم وە ئەم غەزەلەی خوارەوە لە وەڵامی پرسیاری خۆی دا کە فەرموویانە هیچت نەوتووە :

رووکەم لە یاری دێرین، یەعنی نیگاری ڕەنگین
دەسمایەکەی دڵ و دین عوسمانی شێوە شیرین
چی بکەم نەما توانا، لە هیجری بێ ئەمانا
عەقلم تەواوی دانا نەی ماوە تاب و تەسکین
پڕا دڵ و هەناوم خوێناوە ئاوی چاوم
ڕاسە بڵێم نەماوم بۆ ڕابەری من و دین
چی بکەم لە گەرمیانا، تامی نەما لە ژیانا
چارەم هەڵاتنێکە بۆ ڕۆژهەڵاتی نەخشین
بۆ ڕۆژی رووی پیری[1] پیرێکی دڵ مونیری[2]
لێوێکی پڕ تەبەسوم کێوێکی پڕ لە تەمکین[3]
دەستی نەداتە دەستم دەرچم لەدەستی هەستی
ترسم هەیە لە دەستی مەستێکی بێ دڵ و دین
بم دنە بەرزەی زۆر، ڕاوم بنێ هەتا گۆر
هەروا بە ناکەسی چم بۆ ڕۆژی ترس و لەرزین
یارەب منی پڕ خەتا، نەمرم بە ناکەسی تا
دەستم ئەگاتە دەستی پیرێکی جوان و نوورین
یەعنی سیراجەدین و بەدری مونیری تابان

عوسمانی شیخی ئێمەوئێمەی لەسینەنەقشین

١-پیری : پیری تەریقەت.

٢-پیری دڵ مونیرو : مورشیدێک کە دڵی رووناک وبێ گەرد بێ.

٣-تەبەسوم : زەردەخەنە.

٢٣

## فەرمایشتی حەزرەتی پیر

تاقەت لە دڵا تاقە شەکیبایی هەتا کەی[1]

لەم بەفرو هەوا سەردی زستانە خوا وەی

بڕوانە کەژوکێوی دڵم بادەیەوو تەم

سەرماو نەسیمەی دەمەی دوودی هەناسەی[2]

عوسمانە هەموو کێووکەژو بەرزی وەپۆشی

لەم بەفرو کلیلەی خەفەتی مەحشەرە هەی هەی

ڕوو زەردوو سەراسیمەوخوێناوە دڵی من

خوێنی دڵ و ڕەنگە زەردی من دای لەمەی وبەی

ئاوازی دەف و سینەیە، ناڵەی دەف و نەی دێ

زیل و بەمی دل غەمزەدەیە کەی دەفەیانەی

ڕەعدی دڵە، بارانی خەتا، بەفری قەساوت

بە دکارو ڕیاکارو عەمەل پووچی پەیا پەی

لەرزەی دڵەکەی کاری یەسەد تەرزەگوناهی
سەرمایەنی یە بۆی بۆیە لە سەرمایە پەشێوەی
شاهی عەرەبی من بەفیداتم مەدەدێ زوو[3]
مەستی نیگەهی تۆیە دڵ وجەرگمە پەی پەی
شاهی مەدەنی تۆکە شەفیعی هەموو عاسیت
خومن سەگی دەرگاکەتم ڕەحمێ دەسا دەی
هەرچەندە گونەهبارو خەجاڵ ڕوورەش وزارم
خۆئومەتی توم،هەرچی هەبم سەدکەڕەت ئۆخەی
بەوتاوی بەهاری کەرەم وجۆششی ڕەحمەت
با دەرکەوێ باغ وچەمەن و لالەو غونچەی
سینەم کە پڕی غەفڵەتی گەردوو تەمە لوولە
قوربانە،شەها،زوڵمەتی دڵ لا بە،لە بۆکەی
بەو بایە ئەژیم دێ لە مەدینەی عەرەبستان
عوسمان بەفیدای ئەوگومزی ئەخضری قوبەی

١ـ شەکیبایی : خۆراگرتن وصەبروتەحەمول.

٢ـ دوودی : دووکەلی.

٣ ـ مەدەدی: فریام کەوەو یارمەتیم یدە

٢٤

سەوزەزارو نەوبەهارە سەیری سەحراکردنە
کەی زەمانی دەرس و بەحسە یا لە شارا مردنە
هەڵفڕینی سیل و دیقن سەیری سەحراوا چەمەن
وەك دەمی عیسایە گیان بەخشی گیاو گوڵبنە[1]
سەیدا سەیری بەهارو دەشتی شینی ئاودار
خۆشە ئەمڕۆ سوحبەتی ئەحباب و سوبحەی مردنە
سەیری دەشتی لاجیوەردی لێ حەرامە شاکەلی[2]
چاوەنواری تو ئەکا ئەم جەژنە وادەی هاتنە[3]

١- گیاو گولبونە: بنەگوڵ لە بنیا دانیشی.

٢- جیوەرد : شین.

٣- وادەی: کاتی.

٢٥

دەنگی کوردە دێ بەگوێما پڕ لە شادی عوشرەتە
بێ پەناو پەردە بە کوردی بانگ ئەکا لەم میللەتە
کاتی تێکۆشین و هەوڵە بۆ ژیانی یەکتری
دەست و داوێنی هەموو لاوێکی کوردم فرسەتە

دەرکەون، با دەرکەون، لەم فرسەتەی بەش مەبن
هەرکەسێ فرسەت نەناسێ ئاخری هەرحەسرەتە
دەنگی ئازادی هەمووو دنیای بەجاری دا لەبەر
مانەوەی ئێمە لەناوا کاری جەهل و غەفلەتە
ئەوکەسە شێری ژیانە گەر بژێ بۆنیشتمان
خاك و ئاوی ئێمە ئەمڕۆ چاوەڕوانی هیمەتە
ڕۆحەکەم بەندەی کەسێکە وا لە تەدبیرا بژی
مەرکەزی عەقڵە کەوا پێویستی خاوەن قووەتە
سەد کە شێرن لاوی کوردی نوقتەیی تەدبیریان
با لەبەرپێ دانەچن ئەم جا ئومێدی نەسرەتە
بەندەیی سەییدم موخلیسی خاکی وەتەنم
شیعرەکەم قوربانی کوردێکە لەسەرخۆو سابتە

-٢٦-

هەرکە دێتە نازو خەندە لێوی غونچەی گوڵشەنی
وەختە گیانم دەرچێ بۆماچی کوڵم و گەردەنی
گەردەنی بێ گەردوو نازك پەمبەیی سوورووسپی
وەرگەڕێ زوانم ئەگەر بیکەم بە لۆکسی جەرمەنی

لۆکسی جەرمەن هێندە کەی ڕووناکە لایا من بڵێم
مەردوومی چاومە دیارە یاخوخاڵی سەوسەنی
سەوسەنی خاڵ وخەتی گوناى ئاڵی پەمبەیی
چاو خەواڵ و ڕەش و لێوی عەقیقی مەعدەنی
مەعدەنی ئاشووب وجەنگن خوێن ئەڕێژی دووبرۆ
هەروەکو شەمشیری دەستی کوردی مەستی مەوتەنی
مەوتەنی مەئلووفی قەلبم حەلقەی ئەگریجەیە
نەغمە سەنجانە بەمیسلی عەندەلیبی چیمەنی
عەندەلیبی چیمەنی گریانی تەئسیری نەما
چاکی هەڵداوە لەسینەی دلبەری دڵ ئەفگەنی
شیوەنی بۆ دوو بەیی پڕ چنگ ونازك، سەربەمۆر
دڵکە پڕ دەردی فراقی ، دەستی کردە شیوەنی
ئەفگەنی هەر لایقی تویە بە دیدەی مەستەوە
مەست و مەخموورم نەدیوە جەردەیی کاو ڕەهزەنی
ڕەهزەنی شێخ و مەلان خاڵوخەتوغەمزەی بەناز
هادیی شێخ و مەلایە پرتەوی ڕووی ڕەوشەنی

رۆشنە ئەحمەد وەکو ئاوێنە چارەی دلبەرت
سەیری خۆت کەتی شکاوی وەك دوو زولفی سەوسەنی

لە دەستنووسێکی ترا ئەم بەیتە وا نووسراوە:

عەندەلیبی چیمەنی گریانی تەئسیری نەما ❋ دڵکە دەردی فیراقی دەستی کردە شیوەنی

٢٧

ئەوچاوە سیا ڕەنگە کەوا مەنشەئی جەنگە
بەولە شکری موژکانەوە سەرفەوجی فەرەنگە
خوێن ڕێژە، شەر ئەنگێزە، بەد ئەندێشە نیگاهی(١)
ئەوچاوە فتوورسازە ئەڵێی پووری پەشەنگە(٢)
ناڵانە لەبەر تیری موژەت گۆشەی جەرگم
کون کون بووە بنوارە ئەڵێی جێگەی هەنگە
زولف و پەڵکەی کاڵی کەوا زێوەری دۆشن(٣)
ئاڵاوە لەقەدگەردنی ئەو شۆخە قەشەنگە
بڕوانە ئەڵێی سوورەتی حوورە لە نەزەرڎا(٤)
سوبحانە چە شیرینە چەنێ شاهیدوشەنگە(٥)
ئەو عاریزە گوڵنارەکە مەحفوزە بە زولفی(٦)
سەرچاوەی حەیوانەکە دەوری شەوەزەنگە

زاهید مەکەمە نعی دڵەکەم مەستی نیگاهە
تالب بە شلینگیۆیە ئەو عاشیقی شەنگە[7]
قوربانی دەمت بم کە نسیبی منە ماچی
خۆی داوە وەکو وا ئەم غەزەلە قافیە تەنگە
حەیرانی قەدی تۆیە هەوسیاری موژانە
سەرسامی نیگاهی تووە ئەحمەد نە دەبەنگە[8]

١- بەد ئەندێشە : بیری خراپ.
٢- پووری پەشەنگ : پاڵەوانێک بووە کە ناوی ئەفراسیاو بوو
٣- دوشن : شان.
٤- سوورەت : وێنە، شێوە، حوور : پەری.
٥- شاهیدو شەنگ : خۆشەویست
٦- عاریز : عارض، ڕوخسار.
٧- شلینگیتو : شلن پارەی ئینگلیزی یە.
٨- دەبەنگ : بەنگیش، گێژوووێژ.

## ٢٨

لەگەڵ دڵ عەهدە ئەمجارە نەجاتم بوو لەدەس دووری
سەرم دانێم لەسەر بەردی سەری ڕێگت بەمەسرووری
مەگەر شیروانە جەنەت بووجەنابی تۆکە بۆیی ڕۆیی
لە دەرگی ئەسفەلا مامۆمنی لایق بە ڕەنجووری

لە بۆ تۆ بوو کە دەککەم لا، وەکو ڕزوانی جەننەت بوو

ئەمێستە نەشتەری خارە لە بەرچاوم گوڵی سووری

هەموو دنیا لە بەرچاوم سەراوّ[1] و بڵقی خوێنینـــە

ئەوەندەی ڕشتووە چاوم سوروشکی سووری وسوێرە

لە پەنجەی پامەوە تا سەر بلێسەی ئاری مەحرووی

هەڵیقرچان و سووتانی، خودا تەوبە لە مەهجووری

خومار ئەشکەن لە کوێ بێرم من و ساقی لە یەک تاقین

نەبێ کەس وەک منی بێ دڵ ئەسیری دەردی مەخمووری

ئەڵێ "ئەحمەد" لە دووری تۆ وەکو پەروانەو شەمعە

بە قوربانی جەمالت بم سەراپا کۆمەڵێ نووری

موناسەبەتی ئەم شیعرە ئەوەیە کە شێخ ئەحمەد لەگەڵ ماڵی شێخ کەریم دوو ساڵ بەیەکەوە بوون لە ٢٢ جمادی الآخرة ١٣٥٤ هـ ، ٢٢ ئابی ١٩٣٥ ز ـ ماڵی شێخ کەریم ئەگەڕێنەوە بۆ "کەلار" وە لە تاو دەردی دووری ئەم پارچە شیعرەی داناوە. (ج.م)

(١) سەراوّ: مەبەستی سرابە.

٢٩

وا دیارە من لە مەولا ڕێشی یارم[1] پێ خۆشـــە

ناڵەوو شین وچریکەی قەلبی زارم پێ خۆشـــە

بۆ ئەوە تاکو نەکێشم منەتی ساقی و شەراب

ڕوو بەڕوی جانانە چاوی ئەشکبارم پێ خۆشـــە

هاتووم بۆ ماچی کوڵمت باکە زولفیش لا نە دەی
بۆ ئومێدی نۆشی شەربەت نیشی مارم[2] پێ خۆشە

لالە زارە ناوی سینەم پڕ لە خوێنی تک تکە
تاکە پەژمووردە[3] نەبێ من نازی یارم پێ خۆشە

چی لە تەکیەو مەدرەسەی شێخ و مەلا بێ تەرە تەرکی بکەم
پڕلە شۆڕێ عەشقە من خانەی خومارم پێ خۆشە

گەر گەرەکتە تا بزانی مەزهەبم ئەی وشکە شێخ
من بە خوماری نالەیی عەبدێکی خومارم پێ خۆشە

ئایی وئۆیی دڵ لە سەد ذکری ڕیایی[4] خۆشترە
پڕ لە سۆزو عیشق و قەلبی بێ قەرارم پێ خۆشە

مەستی بادەی حەق شناسی کردوم ئێستاکە من
بۆیە نەشئەی چاو مەخووری نیگارم پێ خۆشە

ئەحمەدا ئەمجارە لەفزی شیعرەکانت زۆر زلن
وس بە، بێ دەنگ بە کە من بێ زووان وزارم پێ خۆشە

١-ڕێشی یار: ئازاری یار.
٢- نێشی مار: گازی مار.
٣-پەژموورده: لە روو لاواز بێ خوراک و خواردن.
٤-زیکری ڕیا: ئەو زیکرەی کە یەکێک ئەیکا بۆ ئەوەی پێی بڵێن مرۆڤی چاکە، واتە لەبەر خوا نایکا.

## ٣٠

ئەم پارچە شیعرە سەماحەتی شێخ عوسمان لەحەسەن محەفەرموویەتی و نووسیویە و هەر لەوگەشتەداکە تەشریفی لەکفری یەوە هات و دیدەنی شاکەل ومالی حاجی سەمین پالانی و حەسەن محەی کرد ، بەندەش ـ مەبەست لە شاعیرخویەتی ـ لەخزمەتیا بووم و ، لە ڕاستی دا سەفەرێکی خۆش ولە بیرنەچووەو شەوێکی لە دلا نەقش گرتووبو ... وەلامی کاغەزێکی منی نووسی بووەوەوئەو شەو وای زانیبوو کاغەزی میرزا ئەحمەدی خۆیانە لەکۆتایی داکە حالی بووبوو لە نامەکەدا ئەم پارچەیەی نووسیبوو:

خالۆی عەزیزم شاکەلی مەقام ‖ لەپاشی غەرزی گوڵ دەستەی سەلام
بۆ تەعبیری خەو وەگیانت قەسەم ‖ بۆت بەیان بکەم بێ زیادو بێ کەم
وام زانی نامەی میرزای خۆمانە ‖ چۆن خیتابی وا لەگەڵ تۆمانە
ئیمزای کاغەزت میرزا ئەحمەدی ‖ قەسەم بەرۆحی عودال سەمەدی
جواوی میرزا بۆخوێی نووسرا ‖ ئەویش بەعەکسۆ تەعبیری کرا
قەزیە تەواو مەعکووسە بەلێ ‖ وەناوی کاتب حوکم ئەدرێ
کاغەزهی کێ بووجەواو بوکێ چوو ‖ ببەخشە هیچ کەس لەسەرچوونەچوو
ئەسمای موشتەرەك ولاتی تێك دا ‖ ئیسمی تۆو میرزاکەی وان لە ڕێك دا

ناو بنووسى ئه‌حمه‌د به ته‌نها | مه‌عريفه‌ى نه‌بى حه‌رفيكى وه‌ها
بزانين ئه‌ديب خه‌وى واى ديوه | يا ميرزا خه‌ريك وڕاوه بووه[1]
سيومان بۆ ناردى ته‌شبيه كراوه | وه‌ك ڕووى عابدان ناوى نراوه

١- وڕاوه : وڕێنه

٢٧مارت ١٩٥٧م / ٢٤ شعبان ١٣٧٦هـ.

## ٣١

وه‌ڵامى شاكه‌لى :

شاكه‌لى قوربان سه‌رووى باڵاته[1] | سه‌رگه‌ردى سوداى باڵاى ئاڵاته
سه‌جده‌ى وه‌ميحراوكه‌عبه‌ى كه‌ماڵته | چاوى پڕله ئاوشه‌وقى جه‌ماڵته
منيش غوڵامى ده‌ورى خانه‌قام | زياترله ميرزا به‌دڵ ئاشنام[2]
خيتابت هه‌ر نه‌وع له لام شيرينه | مه‌زه‌ى به‌زمى شه‌وق دڵى غه‌مينه
سيوى لاى تۆبێ ياخو پرته‌قاڵ | ليم حاڵى ئه‌كه‌ن شيوه‌ى شۆروحاڵ
ئازيزم من كه‌ى سه‌وداى سيومه | شيواوى شيوه‌ى له‌فزو ليومه
قوربان سيوى چى كه من ڕووزه‌ردم | زه‌ردى خه‌جله‌ته، ده‌رمانى ده‌ردم
مه‌حجووبيش نابم له به‌دبه‌ختيا | سه‌رم سووڕماوه له‌زام سه‌ختيا
مه‌رتۆ هيمه‌ت كه‌ى به پرته‌قاڵێ | دڵ ده‌ركه‌ى له‌قاڵ بيخه‌يته حاڵێ
ئه‌نا به‌م زامه هه‌ر ئه‌تليمته‌وه | به‌زامى تازه هه‌ر ئه‌كوليته‌وه
به‌ڵام كه زامێ به مه‌يلى تۆبێ | ياخوا بێ ده‌واو هه‌روه‌كو خۆبێ

١- سه‌رروو : دارێكى به‌رزى جوانه

٢- ميرزا : مه‌به‌ستى له [ ميرزا ئه‌حمه‌دى ] بياره‌يه ئێستا كۆچى دوايى كردووه.

-《 ٣٢ 》-

بۆسەماحەتی پیر:

ئەی دەوای دەردی فیراقت رابیتەی سیمای تــۆ

وەی عیلاجی بێ نەوایە گوشــە ئیمایی تــۆ[1]

گۆشەیەکی چاوی تۆ توشەی دیاری ئاخیرەت

مەنبەعی دنیاو دینە مەسکەن و مەئوایی تـۆ

مەسکەن و مەئوای تۆ شەوق و نەشاتی ئیمەیە

سوورمەیە بۆچاوەکانم خاک و خۆڵی پایی تـۆ

پایی تۆگەر بێ بەسەرما تاجی شاهنشاهی یە

چی لە پاشایی بکا دەروێشەکەی دەرگایی تـۆ

کێ لە دەرگاهی تۆدا مەحرووم و بێ بەش ماوە تـۆ

کەس نی یە مەئیووسی نان و خوانی خوا پێداوی تـۆ

خوانی خوا پێداوی تۆ بۆ خوایە (مەعلوم) سابیتە

حاتەمی چی، ماتەمە بۆ مەجمەعی ئەعدایی تـۆ

مەجمەعی ئەعدای تۆ باسەر لە خوار و حیرەبن

پڕ زیایە چونکە ڕۆژی ڕاسی شوق ئارایی تـۆ[2]

شوق ئارایە دڵی هەرکەس کە شەوقی تۆی بێ

سەد هەزار خۆزگەم بەوانە وا دڵی وا لایی تـۆ

لایی تۆ بێ "شاکەلی" ئەوسا فەرح بەخشی دڵـــە

هەر ئەسیرە گەرچی میرە شاهی من مەولایی تـۆ

١ـ ئیمایی: بۆ ڕوانین، ئاوردانەوە، [الاشارة]

٢ـ زیا: ڕووناکی.

## ٣٣

وەڵامی کاغەزی ئەحوال پرسی دەغڵ و دانی شاکەل بۆحاجی ئیبراهیم

هەر بژی سەربەرز و ئازا بە شقی عوسمان وعەلی

چون لە دڵتایە پەژارەو پیری هۆزی شاکەلی

شاکەلی داوای لەخوایە دەرکەویت و سەرکەویت

سەرکەویتە سەرسەران و دەس بخەیتە سەرملی

سەرملی بووکی تەرەقی قۆڵی تـــۆ گردەن بەنی

یا نیکاحی کا لە تۆ ئەحمەد بە قەولی حەنبەلی

حەنبەلی حەولێ بدا ئەمجارە بۆ دیداری تـۆ

ڕۆحەکەم بێ غەم بە بۆمن شاکەلی و میکائیلی

شاکەلی و میکائیلی بەهەری خوابێ داوی یـە

پڕلە گەنم وجۆی ڕەزایە دەشت وهەردەی سەرکەلی

سەرکەلی شینە وەکو دەشتی هەموو شینایی یە

شیوو سەرپەل شین و ڕوونە ئاوەکانی جۆگەلی

جۆلەلەی بۆ مەزرەعەی ئومێدی عەفوم لای خـودا
روون و ڕووناك و ڕەوانە وەك شەتاوی مەندەلی
شەوق ئارایە دڵی هەرکەس کە شەوقی تۆی بێ
سەد هەزار خۆزگەم بە وانە والەلای تۆیە دڵی

## ٣٤

وەرە نازی تەماشاکە کەلاوەی کاکی کولیایی
نیازو نازی چی شێخم مەنازەچەرخی مینایی
گەلێ شێخی بە شاخادا بناغەی ئاغەشی دەرکرد
ئەمیری زۆری زۆرداری لەبن هێنا بەئەسپایی
کلاّنی کاول وکۆنیش بە دەنگی بەرز ئەلێ میرم[1]
ئەتۆش نەختێ لەسەر دەرکە توخوا خولیای کولیایی[2]
ولان چەقیازی[3] بۆکەس هەتا سەرقەت دەسی داوە؟
ئەبێ ڕۆژێ برووخێنێ ژیانی قاسم ئاغایی[4]
ئەگەر میری، ئەگەر پیری، ئەگەر ئاغای بە تەدبیری
دڵی ڕەنجبەر مەرەنجێنە لەبۆ چەڵتووکی مەولایی

